# مەسەلەی توانایی

**چەند دید وچەند سوودێك**

م. ئەحمەد مەولانا
______________

یەکێك لەو گەورە دەسکەوتانەی تاوانباران توانیویانە بە دەستی بێنن ئەوەیە کە پێیان کراوە متمانەی موسوڵمانان بە ڕەگ وڕیشەیان وتوانای کارا بوون وکاریگەری خستنە سەر ڕێڕەوی ڕووداوەکان وگۆڕینی موجرەیاتی ژیانیان لێ زەوت بکەن، دەرەنجام چینێکی فراوانی خەڵك دروست بوون چاویان ئەودیو بەرژەوەندییەکانی ژیانی خۆیان وکاروباری دونیا بڕ ناکاتو، بازنەی بایەخیان لە دەوروبەر عیبادەتە ودروشمەکانی دینداریدایە[1]، بە جۆرێك خۆیان لە کاروباری گشتی موسوڵمانان وپرس ودۆخە مەزن وچارەنووس سازەکانیان دوورە پەرێز بگرن.

کە چاو دەکەینە قورئان وسوننەتی پێغەمبەر وبە پەیڤەکانی مێژوودا دەچینەوە، ئەبینین دەوای ئەم دەردە کوشندەو مەترسیدارە لە جوان تێگەیشتن وحاڵی بووندایە لە پرس ومەسەلەی توانایی.

[1] وەك نوێژ ورۆژوو وعیبادەتانی وەك ئەوان

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْسَاً إِلَّا وُسْعَهَا}[2] - خوا ئەركی لە توانا بەدەر، بەسەر كەسدا ناسەپێنێ - لە میانەی ئاسەوارەكانی ڕەحم وبە زەیی پەروەردگار بە بەندەكانی ئەوەیە كە خوای پەروەردگار شتێك ناخاتە ئەستۆی بەندەكانی بە دەر لە سنووری هێز وتوانایان بێت، كە بەندەكانی تاقی دەكاتەوە بە ئەندازەی توانایان تاقیيان دەكاتەوە، سَعدُ بنُ أَبِي وَقَّاص دەگێڕێتەوە دەفەرمێ: بە حەزرەتم گوت ئەی پێغەمبەری خوا: لە نێو خەڵكا كامەیان تووشی بەڵای قورستر وناخۆشتر دەبن ؟ فەرمووی: "پێغەمبەران، جا هەر كەس پتر لەوان بكات وشەبیهی ئەوان بێ، پیاو بە قەد دین ودینداریيەكەی تاقی دەكرێتەوە، ئەگەر دینەكەی توند وبە هێز بوو تاقیكردنەوەشی سەخت ئەبێ، ئەگەر دینەكەشی ناسك بوو دی بەو پەڕ وئەندازەی دین ودینداریيەكەی تاقی دەكرێتەوە، بەندە ئەوەندە تووشی بەڵاو تاقیكردنەوە دەبێ تا وای لێ دێ بەسەر خاكدا ڕێدەكات هیچ گوناهێكی پێوە نییە"[3].

وەختێك لەم ئەسڵە دەگەین، چیتر دەرفەت بۆ كەسێك نییە بڵێ حاڵی موسوڵمانان وباشتر كردنی ئەستەمە، چونكە ئەوەی بەڵاو تاقیكردنەوەیە بەسەر موسوڵماناندا دێ لە بازنەی هێز وتواناياندایەو دەتوانن بە هەوڵ وتەڵاشدان - بە پێی توانا - وسەبر وخۆڕاگرییەوە تێپەڕیكەن، پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لە فەرموودەدا دەفەرموێت؛ "وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ - بزانە كە سەركەوتن هاوەڵی سەبر وخۆڕاگرییە" .. كەسیش پێی وا بێ نەخێر باسەكە بە جۆرێكی ترە دیارە كە نسبەتی زوڵم وستەم كردن لە مرۆڤەكان بە خوای پەروەردگار ئەدات، خوای پەروەردگاریش دیارە كە لە زوڵم وستەم بێ بەرییە، پەروەردگار دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ}[4] دیارە خوا - بە هیچ ئاوا - ناهەقی لە

[2] البقرة - ٢٨٦

[3] الترمذي (٢٣٩٨) - ئیمامی ئەلبانی بە دروستی لە قەڵەم داوە [صحيح] (المشكاة - ١٥٦٢)

[4] سوورەتی یونس - ٤٤

مەردم ناکا؛ بەڵام مەردم ناهەقی لە خۆیان دەکەن. لە فەرموودی قودسی دا هاتووە: "يا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسي" [5] - بەندەکانم، من زوڵم وستەمم لە خۆم حەرام کردووە.

٢- پێغەمبەر؛ صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: "أَوْكِ سِقاءَكَ واذْكُرِ اسمَ الله، وَخَمِّر إِناءَكَ واذكُرِ اسمَ الله، وَلَو أَنْ تَعْرِضَ عَلَيْهِ عوداً" [6] - ئاوکێشەکەت دەمبەستکەو یادی خوای بکەوە، جامەکەت داپۆشەو ناوی خوا بێنە، [هیچ نەبوو] چیلکەیەکیش بخەیتە سەری [هەر کافییە].

لە گێڕانەوەی ئیمامی أبو داود دا دەفەرمێ: "فَإِنَّ الشيطانَ لا يَفْتَحُ باباً مُغْلَقاً وَلا يَحِلُّ وِكاءً وَلا يَكْشِفُ إِناءً" – دیارە کە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، بەرەبێنیش لێك ناکاتەوەو هەڵناوەشێنێتەوەو، [سەری] جامیش هەڵناداتەوە.

فەرموودەکە وامان ئاڕاستە دەکا ئەگەر لە چیلکە دارێکیش زیاتر هیچی ترمان دەسنەکەوت هەڵیگرین وجامێکمان بوو پێی داپۆشین، بەو جۆرە شەیتان تخونی ناکەوێ، لەگەڵ ئەوەی چیلکە دارێك تەواو جامەکە داناپۆشێ، بەڵام کە خوای پەروەردگار دەبینێ ئێمە لەوەمان زیاتر پێ ناکرێت وتاقەتمان پێی ناشکێ دەیکاتە بەربەست لە بەردەم شەیتاندا. خوای پەروەردگار وای ئاڕاستە نەکردووین دوژمن چەند هێزی هەبوو ئێمەش بەو ئەندازە هێزی بۆ ئامادەکەین، خوای تعالی دەفەرموێت: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ} [7] - تا بۆو دەکرێ ولە تواناتاندایە

[5] ئیمامی موسلیم
[6] متفق علیه – هەردوو ئیمامی بوخاری وموسلیم ریوایەتیان کردووە
[7] سوورەتی الأنفال – ٦٠

هێز وقوەت [8] وئەسپی سواری پەیداکەن وئامادەکەن، دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن، ئی تریشی [پێ بتۆقێ] کە نایانناسن بەڵام خودا دەیانناسێ.

کە پۆلێکی یارانی مووسا دەرکیان بەو ڕاستییە کرد وتیان: {ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} [9] دوو پیاو لەوانە لە خوا دەترسانو بەر چاکەی خودا کەوتبوون، پێیان گوتن: لە دەروازەی شار بچنە ژوورەوەو هێرشیان بۆ بەرن؛ هەرگا پاتان خستە ئەودیو، سەرکەوتن بەشی ئێوەیە. ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەیە خۆتان بە خودا بسپێرن.

ئەوە خۆسپاردنی بڕوادارانە بە پەروەردگار وبێ سوویی ودڵنیایی ئەو ئیماندارانەیە کە پەروەردگار بەڵێنی سەرکەوتنیان بۆ دەباتە سەر، وهەوڵ تەلاشی ئەو خاوەن بڕوایانەیە - لەوەندەی پێیان دەکرێت - وگرتنەبەری ئەو هۆکارانەیە کە لە بەردەستدان، خوای پەروەدگار پیت وبەرەکەت دەخاتە نێو کار وکردەوەکانیانو ترس ولەرز لە دڵی دوژمنینیان دێخێتو، ئەگەر چی لە ڕووی هێزی مادییەوە لەگەڵ دوژمنانیان هاوسەنگ نەبن، بەڵام سەرەڕای ئەوە سەریان دەخات وبراوەیان ئەکا.

مێژوو بەسەرهاتی غولامەکەی ئەسحابی ئوخدود مان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ (غولام لە ڕێگا تووشی دەعبایەکی گەورە بوو ڕێی خەڵکی بڕیبوو، وتی: ئەمڕۆ [کاتی خۆیەتی] بزانم کێیان باشترە؛ کابرای سیحرباز یا کابرای راهیب، بەردێکی هەڵگرت وگوتی: خوایە

[8] شیخ عبد الرحمن بن ناصر السعدي لە تەفسیردا دەفەرمێ: "واتا هەر جۆرە هێز وقوەتێك، چ هێزی عەقڵی وچ هێزی جەستەیی وجۆرها چەك وهەر چی هاوكار بێ لە شەڕ وقیتالیان دا ..."
[9] سوورەتی المائدة - ٢٣

گەر تۆ کاری راهیبەکەت لە سیحربازەکە پێ پەسەندترەو ئەوت زیاتر خۆشدەوێ، ئەم دەعبایە بکوژە خەڵکەکەش تێپەڕ بن .. بەردەکەی تێگرت وکوشتی وخەڵك تێپەڕ بوو).

ئاخیری دەڵێین: شەیتان لە وەختی تەنگانەو میحنەتدا دێت وشکستی دەروونی لە دڵی موسوڵمانان دێخێ، بە یار ویاوەرەکانی خۆی بڕواداران دەترسێنێ، وایان دێنێتە بەرچاو کە ئازاو پۆڵاو توند وزبرن‌و، بەوەش دەروونی ئیمانداران سستی ولاوازی تێدەچێتو، ترس وبێ غیرەتی دڵیان دادەگرێو، مرۆڤ هەستکردنی بە ڕەگ وڕیشە خۆی وئامادەگی وتوانای بەرگریکردنی لە دەست دەدا ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} [10]- لە ڕاستیدا ئەوە شەیتانەو **[گەرەکیە ئێوە]** لە هاودەستانی خۆی بترسێنێ. ئێوە لەوان ترسوو نەبێو ئەگەر بڕوادارن دەبێ هەر تەنیا لە من بترسن.

ئەشتوانین ئێمە بە جوان خۆ سپاردنمان بە پەروەردگار ودڵنیا بوونمان لەوەی پەروەردگار بەڵێنی خۆیمان بۆ دەباتە سەر وبەندە بڕوادارەکانی سەردەخات بەسەر ئەم تەرزە شەیتانییە غالب بین، لەگەڵ ئەو حاڵی بوونە دروست وپاراوەی مەسەلەی توانایی وئاگاهی ئەوەی کە تەواوی شتانێك لە گەردووندا لە ژێر دەسەلات وقودرەتی خوای پەروەردگارنو، شەیتان ویارانی هیچێکی ئەم دونیایەیان لە بەردەست نییەو، فڕ وفێڵ وپلانیان هەر چەند زل وگەورە بێ لە ئەنجامدا هیچ ولاوازە، {فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا} [11] - دەسا ئێوە بچنە شەڕی ئەوانەی دۆستی شەیتانن، فێڵی شەیتان زەبوونو بێ هێزوپێزە.

---

[10] سوورەتی آل عمران - ١٧٥

[11] سوورەتی النساء - ٧٦

